بەشی

١

زنجیرە وتاری

# (عەلمانیـەت و داگیرکاری)

وتاری مامۆسـتا
فواد هەرتەلی

نوسینەوەی
پێگەی نهاوند




عەلمانیەت و داگیرکاری

خۆشەویستان باسی دینێك ئەکەین کە ئەمڕۆ بەر بڵاوترین دینی سەر ڕوی زەمینە ، ئەم دینە زۆربەی زۆری خەڵك هەیەتی بەڵام ئاگای لە خۆی نیە ، بەشێکیان ئەزانن کە ئەمە دینێکی ترە و پابەندن پێیەوە وە خەڵکانێکیش پابەندن وە نازانن پێچەوانەی دینەکەی خۆیانە . ئەوجا ئەو کەسە بەناو یەهودی بێت یان نەسارابێت یان موسڵمان بێت ، یان هەردینێکی تر بێت ، ئەم دینە لە وڵاتە ئیسلامیەکان تەمەنی ئەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٩٠ ساڵ ، لەکاتێکدا تەواو پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە ، وەلە رۆژئاواشدا ئەم دینە لەساڵی ١٧٨٩ دروست بووە لە دوای شۆڕشی فەڕەنسا ، هەرچەندە مەسیحیەکان هەر لە سەرەتاوە لەسەر دینەکەی خۆیان نەمابون بەڵام لەدوای ئەو شۆرشەوە بەتەواوی دینەکەیان لەدەوڵەت جیاکرایەوە ، بەڵام وەك وتم لە دەوڵەتە ئیسلامیەکان تەمەنی ئەم دینە ٩٠ ساڵە لە دوای ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی ساڵی ١٩٢٤ وە سەری هەڵداوە زۆربەی بەناو موسڵمانان ئێستا پابەندی ئەم دینەن نەك بە دینە ئەسڵەکەی خۆمان کە هەڵقوڵاوی قورئان و فەرموودەیە ، جا پێم وایە زۆربەی خەڵکی ئاگایان لێنیە کە ئەمە دینێکی ترە ، بۆیە من ئەو بانگەوازەم بۆ ئەوانەیە کە خاوەنی عەقڵن وخاوەنی بیرکردنەوەن کاتێک گوێی لێئەگرن یان ئەیخوێننەوە باش لێی تێبگەن بۆ ئەوەی کە مردن نەڵێن نەمان زانی ، وە ئێمەش ئەگەر لەوانە بین کە خوای گەورە هیدایەتی دابین واجبی سەر شانمانە کە کەسانی چوار دەورمان ئاگادار بکەینەوە ئەگەر بەڕاستی خۆشیانمان ئەوێن ئەبێت بلێین فلان ئاگاداربە ئەمە دینێکی ترە کە تۆ لەسەری کە ئەویش دینی عەلمانیەتە نەك شەریعەتەکەی خوای گەورە تبارک وتعالی، بۆیە ئەبینی خەڵکانی لای خۆمان هەتا بلێی میوان دۆستن مرۆڤ دۆستن ، حەز ئەکات ئەوەی لەماڵیدا هەبێت لەبەردەمت دایبنێت لە دڵفراوانی خۆی ، یان لە خۆشەویستی گلەی ئەکات ئەڵێ بۆ نەهاتی دیارنیت ، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەبینی لەسەر دینی ئیسلام نیە ، مەبەستم دینە ڕاستەکەیە ، جا ئەو دینەش دینی عەلمانیەتە ، وە تۆ ئەبینی ئەو کەسە نزیکەت ئەو دۆست و خزمەت لە سەر دینی عەلمانیەتە و خۆشی بە موسڵمان ئەزانێت کە ئەمە دوو شتی لێك جیاوازە و هەستیشی پێناکات بۆ؟ لەبەر ئەوەی لەمانای وشەکە تێناگات وە لە مانای ناوەڕۆکەکەشی تێناگات ، وە ئەوەی

لەپاڵ ئەم دینەشدایە لە سەحابە و پێغەمبەرەکەیان با بزانین کێن و بیان ناسن ، بۆیە ناکرێت کەسێك لەهەمان کاتدا موسڵمان بێت و عەلمانیشبێت ، چونکە دوو شتی زۆر لەیەك جیاوازن ، خۆ ئەگەر لەعەلمانیەت بزانی ئەوە پێم وانیە نوێژبکەی وە پێم وانیە باسی حەرام و حەلال بکەی وە پێشم وانیە خێزانەکەی خۆت مارەبکەیت چونکە، عەلمانیەت پێچەوانەی حەرام و عقوبات و دەس برین و ڕەجم کردن وتەواو دژی شەرعی ئیسلامە، بۆیە ئەگەر تۆ عەلمانیت بۆ خێزانت مارە ئەکەی؟؟ وە برۆ تەڵاقی بدە بەڵکو لەسەر جادە بیدۆزەوە و هەر لەسەر جادەش بیدۆڕێنە چونکە بانگەواز و دینەکەی تۆ بۆ ئەوەیە، یاخود من زۆرم پێ سەیرە ئەوکەسەی کە عەلمانیە پێی ناخۆشە کە کوڕەکەی بەجۆرێك پرچی دانێت ئەڵێت ئەوە جوان نیە کچانەیە ، باشە بۆ تۆ عەلمانی بەچی تێگەیشتوی ؟؟ باشە خۆ لە عەلمانیەت ئەبێت زۆر پێت ئاسای بێت کوڕەکەت شوبکات و نابێت پێشت ناخۆش بێت مادام تۆ عەلمانیت ، وە ئەبێت زۆر بەلاتەوە ئاسای بێت ئەگەر کارتی بانگهێشتنامەت بۆ بێت لای خزمێکی نزیکتەوە و تیای نوسرابێت خۆشحاڵین بەهاتنتان بۆ ئاهەنگی بەشودانی کوڕەکەم بەڵام ئەگەر ئەلێیت ڕازینیم ئەوە واتا تۆ تێناگەیت لە مانای عەلمانیەت ، وە کە ئەشلێیت من موسڵمانم ئەوە بێگومان دەبێت تۆ نوێژ کەر بیت و ئەبێت زەکات بدەیت و ئەبێت بەڕۆژو بیت و ئەبێت بە حەڵاڵ و حەرامەکان ڕازیبیت ئەبێت ئەو حیجابەی بە خێزانتەوەیە پێی ڕازی بیت و ئەبێت کە دەستی دز ئەبڕن پێی ڕازی بیت وە ئەبێت ڕازی بیت بەوەی کە لە میرات دوو خوشك بەرامبەر یەك برایە کە بەمانەو تەواوی شەریعەتی ئیسلام ڕازی بویت ئەوە پێت ئەوترێت موسڵمان ، بەڵام تۆ نیوە موسڵمان و نیوە عەلمانی ئەمە شتێکی زۆر ناڕەوایە و خوای گەورەش ئەم دووڕوییە قەبوڵ ناکات خوای گەورە ئەفەرمێت (إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ)(١) واتا حوکم تەنها بۆ خوای گەورەیە ، بەڵام کاتێك تۆ ئەلێی من عەلمانیم ئەوە واتا ئەلێیت من نوێژم قەبوڵە و ڕۆژوم قەبوڵە بەڵام ڕازی نابم خوا حەرام و حەڵاڵم بۆ دابنێت ،

١.(یوسف. ٤٠)

بەڵکو خۆم دەنگ ئەدەم بە پەرلەمان و بە حیزبی عەلمانی کە ئەوان حەرام و حەلالم بۆ دائەنێن ، جا ئەلێن با کچەکەت بێتە دەرەوە ببێتە شاجوان و لێگەڕێ کوڕەکەت با بە ئارەزوی خۆی زینا بکات یان هەرچیەك کە خۆی ئەیەوێت لە حەشیشە کێشان و نێرگەلە من ئەمەم پێ ڕاستە نەك ئەوەی کە خوای گەورە ئەفەرمێت زینا حەرامە و تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەت حەرامە تێکەڵاوی ژن و پیاو حەرامە ، بەڵام خوای پەروەردگار ڕازینیە کە لە لایەك نوێژ و ڕۆژوت هەبێت وە لە لایەك بە پێچەوانەی شەریعەتەکەی ئەو بجولێیتەوە ، چونکە ، ئەو هەوییەی کە لە گیرفانتدایە و لەسەری نوسراوە حزبی عەلمانی یان دیموکڕاسی یان سۆسیالیست یان کۆمۆنیست یان شیوعی ، ئەگەر لە ماناکانی تێبگەی ڕێك پێچەوانەی شەریعەتەکەی خوای پەروەردگارە ، وە کاتێك دێت قورئان ئەخوێنیتەوە بۆت دەرئەکەوێت کە ئەم عەلمانیە ئەم دیموکراسیە ئەم سۆسیال دیموکرات و ئەم لیبراڵیەی کە شانازی پێوە ئەکەیت بە پێوەری خوای گەورە هەمووی حەرامە شیرکە و کوفرە و فسقە و نیفاقە بۆیە ناکرێ و نابێ نوێژ بکەیت و بەڕۆژو بیت و عەلمانیش بیت ، ئافرەت هەیە لەچکی لەسەرە و قاچیشی هەتا بان چۆکی ڕوتە باشە خۆ هەموو عالەم بە دیندار و بێدین ئەزانێت ئەمە دووڕوییە ، ئێ باشە ئەمە بۆ وایە !؟ ئاخر نابێت ئازیزی من نیوەت بۆ خوا و نیوەت بۆ شەیتان ، ئەمە وەك ئافرەت ، بۆ ئەو کەسانەش کە لە حیزبی عەلمانیدان هیچ فەرقی نیە لەگەڵ ئەم ئافرەتە نەفام و نەزانەدا کە سەری پۆشە و بنیشی بۆشە ئەمە ناکرێت ئەم دووڕویی و فسقە خوای گەورە قەبوڵی ناکات بەڵکو یەك لای کردۆتەوە (إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ)(١) واتا حوکم یاساو حەرام و حەلاڵ تەنها بۆ خوای گەورەیە ، بۆیە ئەگەر بێت و یەکێك لە یاوەرانی ئەشکەوت بە ئەمری الله زیندوو بێتەوە و بێتە ناو ئەم موسڵمانانەی دوای خیلافەتی عوسمانی دەبینی زۆر دەستەواژە هەیە لێی تێناگەن بۆ نموونە یەکێك ئەلێت بەشێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژاردنمان کرد یان ئێمە دیموکراتی خوازین یان یەکێك دەلێت من موسڵمانێکی عەلمانیم وە یەکێك ئەلێت من کوردم ئنجا موسڵمانم

١.(یوسف. ٤٠)

بێگومان ئەو ئەڵێت ئەمە چیە ئێمە شتی وامان گوێ بیست نەبووە لە قورئان و فەرمودەش شتی وامان نەبیستوە کوا بۆم شی بکەنەوە بزانم واتای چیە ئەم دەستەواژانە ، جا کاتێك بۆیت شی کردەوە باوەڕناکەم بهێڵێت پێش نوێژی بۆ بکەیت هەتا شەهادە نەهێنیتەوە چونکە عەلمانی واتا جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت بەمانایەکی تر ڕازیم بە نوێژ و ڕۆژو بەڵام ڕازی نیم بە حەرام و حەڵاڵ ، واتا هەوڵ ئەدەین بۆ دونیا نەك بۆ ئاخیرەت ، جا ئافرەتێک خۆی ڕوت ئەکاتەوە لەش فرۆشی ئەکات وە ئارەق ئەخورێتەوە یان بەخشیش ئەدرێ بەدز لەجیاتی ئەوەی دەستی ببڕدرێت ئەمانە نابێت خوا عیلاقەی هەبێت ، جا ئایا پێتان وایە خوای گەورە بەوە ڕازیە !؟ (وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا)(١) واتا لەحوکم و یاسادانان هیچ کەس هاوبەش و هاوکارم نیە وە قەبوڵیش ناکات وەك چۆن قبوڵ ناکات لە نوێژدا دوو ڕکعاتت بۆ خوا بێت و دوو ڕکعاتیشت بۆ بتێك بێت ئەمە قبوڵ نیە (فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا)(٢) واتا لەگەڵ الله بانگ لەهیچ کەسێکی تر مەکە واتا نابێت بلێی یا غەوسی گەیلانی یا خوا یا رسوالله ، لێرە یا الله کە تەواوە بەڵام یا غەوس و یا پێغەمبەر شیرکە ، ئەمە لە دوعادا وە بەهەمان شێوە لە حوکم کردنیشدا بەهەمان شێوەیە بۆنموونە بلێی ئەگەر دەستی دز ببڕین کەم ئەندام زۆر ئەبێت ئەمەش دژی مافی مرۆڤە ، ئەمە واتای چیە کەواتە تۆ بۆچی نوێژ ئەکەیت ، خۆ ئەمە حوکمی خوای گەورەیە (تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ)(٣) هەرکەسێك ئەم سنورە ببەزێنێت ئەوە ئەو کەسە دەست درێژ کەرە ، کە واتە ئەم قسانە و ئەم بیرۆکانە و ئەم ناسنامەیەی کە لە گیرفانتدایە پێچەوانەی قورئانە ، کە واتە کەسانێك هەن نوێژ ئەکەن وە بەڕۆژو ئەبن دواتر بەشداریان کردوە لە کۆڕێك یان کۆبونەوەیەکی حیزبی یان دەنگیان داوە بە یاسای دەستکرد بەمەش ئاگای لەخۆشی نیە و چۆتە سەر دینێکی تر کە تەواو پێچەوانەی ئیسلامە .

---

١.(الكهف. ٢٦)

٢.(الجن. ١٨)

٣.(النساء.١٣)

هەرچەندە زۆر کەس وا ئەزانێت وشەی عەلمانی لە مانای علمەوە هاتووە بەڵام ئەو وشەیە یان پیتی (عَ)کە فەتحەی لەسەرە بەمانای لا دینی دێت یان دونیا ویستی یانیش بەواتای جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت کە ئەمەش مەبەستە سەرەکیەکەیانە ، ئەمەش واتا دین سیاسەتی تێدا نیە ئەمە بە وتەی ئەوانە کە ئەڵێن سیاسەت واتا درۆ دینیش واتا پاکی بۆیە نابێت ئەم دووشتە بدەینە پاڵ یەك کە ئەمە وتەی کەسانی وەك جەمال عبدالناصر و حوسنی موبارەك و سەدام حسێن و قەزافیە کەهەمویان دیکتاتۆر بوون کەچی ئێستا ئەو وشانە بە کوردی ئەیان بیستینەوە کە ئەڵێن نابێت دین و سیاسەت تێکەڵاو بکرێن ! ئێ باشە دین خۆی واتا سیاسەت جا ئەو قسەیەی ئەوان وەك ئەوەیە بڵێی سورەتی (النور)م قبوڵ نیە کە تەنها لەم سورەتە چل(٤٠) یاسای تێدایە لەبەر ئەوەی ئەو سورەتە باسی یاسا ئەکات پێی ڕازی نین بەڵام سورەتی (الفاتحة) ئەڵێن زۆر خۆشە یان سورەتی (الإخلاص) ئەمانەیان قبوڵە بەڵام سورەتی (البقرة) و (النور)م قبوڵ نیە ئێ باشە خوای گەورە ڕازیە تۆ نیوەی قبوڵ بکەیت و نیوەی قبوڵ نەکەی بە ئارەزوی خۆت ! لەوڵامدا خوای گەورە خۆی وڵامدەداتەوە و دەفەرمێت (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ)(١) واتا ئایا ئێوە بەبەشێکی قورئان ڕازین و بەبەشێکی ڕازینین ؟ کە ئەمە ڕێك باسی عەلمانیە کە بەبەشێکی ڕازین وەك نوێژ و ڕۆژو بەڵام بە شەریعەتەکەی ڕازی نین وە خوای گەورە لە جەزای ئەو کارە ئەفەرمێت( فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ)(٢) واتا جەزای هەر کەسێك کە ئەو کارە ئەنجام ئەدات لەدونیا ڕسوای ئەکات جا بەشەڕی برا کوژی و شەڕە عەلەم(ئاڵا) و شەڕی حیزبایەتی و شەڕی ڕەنگ و شەڕی حدود(سنور) و چەندین شتی تریش کە لە ئەنجامی ڕازی بوونی خەڵکە بە عەلمانی

---

١.(البقرة. ٨٥)

٢.(البقرة. ٨٥)

وە شەڕ و ڕیسواییەکەش وەعدی (اللە)یە کە ئەفەرمێت لە دونیا ڕیسواتان ئەکەم وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا گەورەترین عەزاب ئەدرێن واتا گەورەتری عەزاب چاوەڕێی ئەو کەسانە ئەکات کە ئەمە بیرو باوەڕیانە واتا خۆیان پێ عەلمانیە یان خۆیان بە موسڵمانێکی عەلمانی ئەزانن یان ئەوانەی ئەلێن دین سیاسەت نیە یان سیاسەت دین نیە ، چونکە ئەم شتانە هەمووی کوفرن و پێچەوانەی ئایەتەکانی خوای گەورەن و پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە ، وە من بەڕاستی پێم حەیفە ئەم خەڵکە باش و ڕوح پاکە ئەمە عەقیدەیان بێت ، کە ئەم زەلیلیە و نائارامی و شەڕ و ناخۆشیەی هەیە هەمووی لەبەر ئەویە کە بە شەریعەتی خوا ڕازی نەبوونە یان بونەتە هۆکاری سەرخستنی ئەو جۆرە کەسانە ، وە من گومانی باش ئەبەم بەم خەڵکە و پێم وایە ڕاستی ئەم بابەتە نازانن چونکە من باوەڕناکەم کەس حەز بکات خوا لە دونیا ڕیسوای بکات وە لە قیامەتیش لە جیاتی ئەوەی نوێژ و ڕۆژوەکەی لێ قبوڵ بکات بیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە چونکە خوای گەورە قوفڵی لێداوە ئەو کەسەی شیرکی بۆ بڕیاربدات ئنجا لە دوعابێت یان لە حوکم بێت وە ئەفەرمێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾(١) واتا خوای گەورە لە شیرك خۆش نابێت بەڵام لە غەیری شیرك خۆش ئەبێت لەوەی کە خۆی بیەوێت ، کەواتە ئەمە بابەتێکە زۆر زۆر گرینگە وە ئەمەی باس کرا ڕونکردنەوەیەکی بچووکە إن شاء اللە لە بابەتەکانی داهاتودا زیاتر ڕونی ئەکەینەوە بۆئەوەی بزانین عەلمانی بەڕاستی واتای چیە وە کێ لە پاڵیەتی و مێژووەکەشی چیە ، بۆ ئەوەی کە مردین ڕومان هەبێت بچینە بەردەم خوای پەروەردگار .

---

٣.(النساء. ٤٨)

